# پێشەکیی چاپی دووەم

الحمدلله والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه وحزبه، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم لقائه، أما بعد:

پاش سوپاس و ستایشی بێ سنوور و بێ کۆتا بۆ خوای گەورە و خاوەن زانستی بێ کۆتا، درووود و سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست کە نێدراوە بۆ هەموو خەڵکی تا کۆتا.

دوای بڵاوبوونەوەی چاپی یەکەمی ئەم نامیلکەیەی بەردەستت سوپاس بۆ خوا هەر زوو خوێنەران و فێرخوازانی زانستی شەرعی پێی ئاشنا بوون و سوودمەند بوون لێی، کە ئەمەش جێگای دڵخۆشی هەر نووسەرێکە بۆ هەر نووسنێکی، هەر ئەو کات بەبیرم دێ سەنتەری (نووری حیکمە-لقی سلێمانی) نزیکەی نیوەی تیراژەکەیان کڕی و هەندێکیان لێ لەبەرگرتەوە لەبەر نەمانەوەی لە کتێبخانەکانی ناو شار، وە کردیان بە مەنهەج و بەدەرس خوێندیان و پێشبڕکێیەکیان لەسەری ئەنجامدا، وە هەر ئەو کات بڕیاریان دا چاپی دووەمی لە ئەستۆ بگرن، بەڵام بەهۆی باری داراییەوە ئەو ئەرکەیان ئەنجامنەدا. بەندەش وەکو خاوەنی نووسینەکە لەبەر نەبوونی و دواتر قەیرانی درووستکراوی ئابووری کوردستان و کەمبوونەوەی ڕێژەی خوێنەرانی کتێب بە گشتی تاکو ئێستا خوای گەورە قەدەری نەڕەخساند چاپێکی تری بکەمەوە، ئەگەر چ هەر لەبیرم بوو، بەتایبەتی کاتێك ساڵی پار لە مانگی حەوتی ٢٠١٨ لە سەنتەری (نووری حیکمە-لقی هەڵەبجە)ەوە پەیوەندیان پێوە کردم بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدەم چەندین نووسخەی لەبەر بگرنەوە و وەکو

مەنهەج بیخەنە بەرنـامەی کـاریـانەوە بۆ فێرخوازەکانیان، ئیتر منیش زیاتر و زیاتر بیرم دەکردەوە کە چۆن دەرفەتێـك بـدۆزمەوە بۆ دووبـارە چـاپکردنەوەی، تـا خوا کردی و لە (٢٠١٨/١١/١١ - ١٤٤٠/٣/٣) خۆم (نـاوەنـدی جـابـانی کوردی بۆ زانسـتی شـەرعی)ـــم دامەزراند -سوپاس بۆ خوا- وەکو مەنهەجی قۆناغی یەکەم خستمە بەرنامەی کارەوە.

ئەوەی شایەنی باس بێت ئەوەیە ئەم چاپە تازەیە هیچ دەستکاریی نەکراوە تەنها شـــتێکی زۆر کەم کە شـــایەنی ئـاماژە پێکردن نییە، ئامانج لەوەش هێشـــتنەوەی نامیلکەکە بوو بەو قەبارەیەی خۆی بۆ ئەوەی هەم دیســـان قوتابخانە و ســـەنتەر و ناوەندە شەرعیەکان سوودی لێ ببینن وەکو مەنهەج و زیاتر بە فێرخوازانی زانستی شەرعی ئاشنای بکەن.

ماوەتەوە بڵێم: خوای گەورە لە تاوانەکانی ئەم بەندەیەت خۆش بیت و بەکاری بهێنیـت لە کـاری چـاك و حزمەتکردنی دینەکەی خۆت، خوایە تۆ خاوەنی هەموو شتێکی و هیچ لای تۆ ئەستەم و قورس نییە...

وصلی الله علی محمد وعلی آل محمد

**هۆشیار نصرالدین کەلاری**

**الجامع للقراءات العشر الصغری**

**١٤٤٠/٥/٦ کۆچی**

**شەوی یەك شەممە / کەلار**

# پێشەکیی چاپی یەکەم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين إلى يوم الدين، أما بعد:

مژدە بێت لەو کەسانەی کە ئارامی لە خۆیان تێکدەدەن و بە گەرما و سەرما، بەهەبوون و نەبوون خەریکی فێربوونی زانستی شەرعین لە پێناو پاراستنی دینی خوادا، بێگومان خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەت و پێغەمبەرەکەشی ﷺ لە چەندین فەرموودەدا وەسفیان دەکەن و پێیاندا هەڵدەدەن، بەڕاستی فێرخوازانی زانستی شەرعی پلە و مەکانەتی تایبەتیان هەیە، چ لەم دونیایەدا و چ لە دواڕۆژدا، جا ئەوەندە بەسە بۆ گرنگی و بایەخی زانستی شەرعی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کە ڕاوکردنی سەگی فێرکراو خواردنی دروستە و هی فێرنەکراو دروست نیە، وەك لە سورەتی (المائدة) خوای پەروەردگار بەڕوونی باسی دەکات ...

بێگومان فێربوونی زانستی شەرعی بەوە دەبێت کە فێرخواز بچێتە خزمەت کەسی شارەزا و لە بەردەمیدا چۆك دابدات و گوێڕایەڵی بکات، جا بۆ ئەو مەبەستە فێرخوازی زانستی شەرعی دەبێت ڕەچاوی کۆمەڵێك ئاداب بکات کە زانایان لە کۆن و تازە ئاماژەیان بۆ کردووە و فێرخوازانیان لێ ئاگادار کردوەتەوە، جا بەندە بۆ ماوەیەکی زۆرە لە خزمەت چەندین مامۆستا سەرقاڵی خوێندنی زانستی شەرعیم- سوپاس بۆ خوا- بەتایبەت لە خزمەت مامۆستامان مامۆستا دلێر گەرمیانی -خوا بیپارێزێت- کە بۆ ماوەی زیاتر لە چوار ساڵە لە خزمەتیدا خەریکی خوێندنی چەندین زانستم و خوای پەروەردگار بە فەزڵی خۆی منەتی کردە سەرم و توانیم لە

خزمەتیدا خەتمی قورئانی پیرۆز بکەم بە ڕیوایەتی (حفص) لە قیرائەتی (عاصـــم)، دواتریش (أصول)ـــی دە پێشەواکەی قیرائاتم لە خزمەت خوێند و قۆناغی (الجمع الصغیر)ـــــیشم تەواو کرد و ئێستا لە (جمع الکبیر)دا گەشتوومەتە جوزئی شەشەم بە ســـەنەدی نەپچڕاو بۆ پێغەمبەر ﷺ، داواکـارم لە خوای پەروەردگـار بتوانم لە خزمەتیدا خەتمی بکەم.[1]

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە بەهۆی ئەوەی کە ســوپاس بۆ خوا ســەرقاڵی وانە وتنەوەشـم لە زانستی (تجوید) بە ڕیوایەتی (حفص)، کاتێك هەندێ ڕەفتارم لە فێرخوازە هـاوڕێکـانم دەبینی یـاخود لە فێرخوازەکـانی خۆم کە ئەو جۆرە ڕەفتارانە شـایەنی فێرخوازانی زانسـتی شـەرعی نییە، هەستم کرد پێویست دەکات بە دانانی کـتـێبێکی مەنهەجی لە بواری ئـادابەکـانی فێرخوازانی زانســتی شــەرعی بە چاولێکردنی پێشینی ئەم ئوممەتە.

بۆیە هەڵســـام دەســـتم کرد بە کۆکردنەوە و ئـامـادە کردنی ئەوەی کە ئێســـتـا لەبەردەســـتتدایە بە هیوای ئەوەی خۆم و هەموو فێرحوازانی زانســـتی شـــەرعی ســـوودی لێ وەرگرین و کاری پێ بکەین. جا ڕەنگە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئادابانەدا سەری سوڕ بمێنێ و بڵێ (بەڕاستی جێبەجێ کردنی ئەم ئادابانە لە توانای کەسـدا نیە!!!)، منیش لە وەڵامدا ئەڵێم: نەخێر، بەڵکو لە توانای هەموو کەسێکدا هەیە بەڵام پێویستی بە خۆ ڕاهێنان و ئارامگرتن هەیە و هەروەها پێشینانی ئەم ئومەتە پڕ شکۆیە هەموو ئەمانەیان بە زیادەشەوە جێبەجێ کردووە، بەڵکو بەندە

(١) بەقەدەری خوا تاکو جوزئی هەژدەیەمیش لەخزمەتیدا خوێندم، بەڵام دواتر لە خزمەتی شێخ (حمدی بن شهاب الاعظمی) سەنەدی (القرائات العشر الصغری) ـم بەدەست هێنا.

بۆ خۆی لەم تەمەنە کورتەی فێرخوازییەیدا زۆرێك لەوانەی بە چاوی خۆی دیتووە.

ماوەتەوە بڵێم کە بۆ نووسینی ئەم ئادابانە بە پلەی یەکەم پشتم بەستووە بە کتێبی (آداب الطـالب مع الشـــيخ)ی خالد بن خليل الزاهدي -وەك لەم نامیلکەیەشـــدا دیارە- چونکە بەڕاستی ئەو کتێبە ئەوە بووە کە من بەدوایدا دەگەڕام و هەروەها بۆیە بەشـی چوارەمم زۆر بە کورتی نووسیووە -لەگەڵ ئەوەشدا زۆر گرنگە- چونکە ئەم نامیلکەیە تایبەتە بە ئادابەکانی فێرخوازانی زانسـتی شەرعی لەگەڵ مامۆستاکەیدا، وە بۆ ئەوەی نووسـینەکە هەر بە کورتی بمێنێتەوە، ئەگینا پێشینانی ئەم ئوممەتە لەو بارەیەوە زۆریان نووسیوە.

لە کۆتـایـدا داواکـارم لە خوای پەروەردگـار کە ئەم کـارەم لەبەر خاتری خۆی کردبێت و بیخاتە سـەر میزانی چاکەکانم، هەروەها زۆر سوپاسی مامۆستا (احسان برهـان الـدين) دەکەم ســـەرەڕای ســـەرقـاڵیی بە ئیش و کـاری خۆیەوە ئەرکی پێـداچوونەوەی گرتە ئەســـتۆ، داواکـارم خوای پەروەردگـار کارەکانی بۆ ئاســـان بکات و یارمەتی بدات.

سبحانك اللهم و بحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك و أتوب إليك

**هۆشیار نصرالدين**

**موڵەت پێدراو لە ڕیوایەتی**

**(حفص) لە قیرائەتی (عاصم)**

**١٤٣٤/٥/١٧ـی کۆچی، ٢٠١٣/٣/٢٩ـی لە دایکبوون**

**شەوی شەممە / کەلار**

## پێشەکیی مامۆستا "إحسان برهان الدين":

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه.

زانایان -ئەگەر پەیڕەوی ڕێبازی پێشینانی باشی ئەم ئوممەتە بکەن- میراتگری پێغەمبەرانن و شایستەی هەموو ڕێزلێنانێکن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٩﴾﴾ [الزمر: ٩].

بۆیە فێرخوازانی زانست پێویستە لەسەری ڕێزی زۆری مامۆستاکەی بگرێت، گوێڕایەڵی بێت و خۆشی بوێت و خزمەتی بکات و ئەو ئادابانەی پێویستن بەرامبەر مامۆستا ڕەچاویان بکات و لە خۆیدا بەرجەستەیان بکات، لەم بارەشەوە -لە کۆن و نوێدا- کتێبی زۆر هەن وەکو (التبيان في آداب حملة القرآن)ـی پێشەوا نەوەوی و (حلية طالب العلم)ـی بەکر ئەبو زەید لە هاوچەرخەکان، ئەم نووسینەی برای بەڕێزم مامۆستا هۆشیار خزمەتێکی باشە لەم بوارەدا چونکە لە کتێبخانەی کوردیدا کتێب لەم بەشەی زانستە زۆر دەگمەنە، بۆیە ئەم نامیلکەیە سەرەڕای کەمی لاپەڕەکانی بەڵام سوودی زۆری لەخۆ گرتووە و هیوادارم فێرخوازانی زانستی شەرعی بیخوێننەوە و لێی بەهرەمەند بن.

هاوکات بەباشی دەزانم لەم بوارەدا زێدەڕەوی نەکرێت و ڕێزگرتنی مامۆستا ڕەنگدانەوەیەك بێت بۆ ڕێزگرتن لە زانستەکەی و هەمووشی لە ڕۆشنایی بەڵگەی

شەرعی شەرعدا بێت و دوور بێت لە دەرکردنی مەسەلەکان لە سنووری شەرعی.

لە کۆتـاییـدا داواکارم خوای گەورە پاداشـــتی مامۆسـتا هۆشــیار بداتەوە و نووسینەکەشی بکاتە مایەی خێر و سوودی زۆر.

والحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

**إحسان برهان الدين**

**الجامع للقراءات العشر الصغرى**

**٢٠١٣/٣/٢٨**

**کەلار**

# دەستپێك

گرنگی و بایەخی زانستی شەرعی:

ئایەت و فەرمووده و وتەی زانایانی سەلەف و خەلەف زۆرن لەسەر گرنگی و بایەخی زانستی شەرعی، لەوانە:

**یەكەم: ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز:** دیارە قورئانی پیرۆز چەندین ئایەتی تێدایە سەبارەت بە گرنگی و بایەخی زانستی شەرعی، لەوانە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ١٢٢﴾ [التوبة: ١٢٢]؛ واتە: (حەق نەبوو باوەڕداران هەمووی بە جارێ بچنە جیهاد و شار و گوندەكان چۆڵ بكەن، با لەباتی ئەوەغ هەمووی بچنە دەرێ، لەناو هەر دەستەیەك چەند كەسێكیان بچنە دەرێ بۆ ئەوەی لە كاروباری ئاینیدا شارەزا و ئاگادار بین، كە لە گۆڕەپانەكانی جیهادیش گەڕانەوە ناو خێڵی خۆیان بیانترسێنن و هۆشیاریان بكەنەوە بەڵكو لە بێ فەرمانی خودا خۆیان بەدوور بگرن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ١١٤﴾ [طه: ١١٤]؛ واتە: (بڵێ پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بكە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨﴾ [فاطر: ٢٨]؛ واتە: (بەڕاستی لە بەندەكانی خوادا هەر زاناكانن لە خوا ئەترسن و سەری نەوازشی بۆ دادەنەوێنن).

هەروەهـا دەفەرموێـت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ۝٩﴾ [الزمر: ٩]؛ واتە: (بڵێ ئایا ئەو کەسـانەی کە زانان و شـارەزان لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە نەزان و نەشارەزان یەکسانن؟ بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە تەنها مرۆڤە زیرەکەکانن بیردەکەنەوە و ئامۆژگاری وەردەگرن).

هەروەهـا دەفەرموێـت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ۝١١﴾ [المجادلة: ١١]؛ واتە: (خوا ئەو کەسـانەتان کە باوەڕیان هێناوە بەرز دەکاتەوە و ئەوانەشـی زانسـتیان پێدراوە پلەگەلێ بەسـەر باوەڕدارەکاندا بەرز دەکاتەوە). بۆ تەفسـیری ئایەتەکان بگەڕێنەوە بۆ (تەفسیری ڕامان).

**دووەم: فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ:** دیارە چەندین فەرموودەی پیرۆزمان هەیە سەبارەت بە گرنگی و بایەخی زانستی شەرعی، لەوانە: (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ)[1]؛ واتە: خوا خێری بۆ هەرکەسێك بوێت لە دین تێی دەگەیەنێت).

هەروەهـا دەفەرموێـت: (مَن خرَجَ في طَلَبِ العِلمِ، كـان في سَـبيلِ اللَّهِ حَتَّى يرجِعَ)[2]؛ واتە: (هەر کەسـێك لە ماڵ دەرچێت بۆ فێربوونی زانست ئەوە لە پێناوی خوادایە هەتا دەگەڕێتەوە).

هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ)[3]؛ واتە: (هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ فێربوونی زانست، ئەوە خوای

---

(١) بخاري (٧١)، مسلم (٢٣٨٦)، أحمد (١٦٨٣).

(٢) ترمذي گێڕاویەتییەوە و دەفەرموێت: حديث حسـن (٢٦٤٩)، بەڵام شێخی ئەلبانی لە (ضعيف الترمذي)ـــدا بە (ضعيف)ــــی داناوە بە ژمارە (٤٩٤). بڕوانە (رياض الصالحين) بە تەحقیقی علي حلبي.

(٣) مسلم (٦٧٩٣)، أحمد (٧٤٢٧).

گەورە ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات).

هەروەهـا دەفەرمویـت: (الـدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلعون مَا فِيهَا، إِلاَّ ذِكْرَ اللَّه تَعَالَى، ومَا وَالاَهُ وَعالماً وَمُتَعلِّماً)[1]؛ واتە: (دونیا و ئەوەشـــی تێیدایە نەفرەت لێ كراوە، تەنها یـادی خوای گەورە و گوێڕایەڵی فەرمـانەكـانی خوای گەورە و زانـا و فێرخواز نەبێت).

هەروەهـا چەنـدین فەرموودەی پیرۆزی تر كە هێنـانی هەموویـان زۆر درێژە دەكێشـــێت و پێویســـتی بە كتێبێكی تایبەتە و ئێرە جێگەی نیە، بۆیە هەركەســـێك ئەیەوێت ئەوا با بگەڕێتەوە سـەرچاوە سەرەكیەكانی لە كتێبی زانا پێشینەكان و ئەو كتێبـانەی كە تـایبەتن بەم بـابەتە یـان ئەو بابانەی كە لە كتێبەكانی فەرموودەوانیدا نوسراون و جێگەی تایبەتیان بۆ ئەم بابەتە گرنگە داناوە.

**سێیەم: وتەی پێشەوایانی سەلەف:** بێگومان پێشەوایانی سەلەفی ئەم ئوممەتە وتە و پیاهەڵدانی زۆریان هەیە سـەبارەت بە گرنگی و بایەخی زانسـتی شـەرعی، بەڵام لێرەدا هەندێكیان بەنموونە دەهێنینەوە، لەوانە:

وتەی (معاذ) ڕەزای خوای لێ بێت، دەفەرموێت: (فێری زانســـت بن، چونكە فـێـربوونی بۆ خوا خەشـــیەتە و داخوازی كردنی عیبـادەتە و پێـداچوونەوەی تەسبیحاتە و گەڕانیش بەدوایدا جیهادە و فێركردنی ئەوەی كە نازانێت صەدەقەیە و پێدانی بە ئەهلی خۆی نزیك بوونەوەیە لە خوا).[2]

(١) ترمـذي گێڕاویەتییەوە و دەفەرموێت: حديث حســـن (٢٣٢٢)، شـــێخی ئەلبانیش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە (صحيح وضعيف سنن الترمذي)ــدا ئەفەرموێ (حسن).

(٢) كتێبی (عاشق)ـی د.عائض القرني (لا ٢٧-٢٨)، كە بەڕاستی كتێبێكی زۆر نایابە لە بواری زانستی شەرعیدا.

هەرووەها (أبو درداء) ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت: (هەرکەسێك وای ببینێ کە ڕۆیشتن بە دوای زانستدا جیهاد نیە ئەوە کورتی هێناوە لە بۆچوونەکەی و لە عەقڵیدا).[1]

هەرووەها (الماوردی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەگەر هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ فێربوونی هەموو زانستەکان، ئەوە پێویستە هەوڵبدرێت بۆ زانینی گرنگترینیان و گرنگیدان بە باشترینیان و باشترینی زانستەکان، وە لە پێشترینیان زانستی دینە، لەبەر ئەوەی خەڵکی بەهۆیەوە سەر ڕاست دەبن و بە نەبوونی گومڕا دەبن....).[2]

هەرووەها پێشەوا (شافیعی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (فێربوونی زانست لە نوێژی سوننەت باشترە).[3]

هەرووەها لە وتەیەکی تریدا دەفەرموێت: (ئەوەی دونیای دەوێت با فێری زانست ببێت و ئەوەشی قیامەتی دەوێت با فێری زانست بێت).[4]

هەرووەها (ابن حزم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت:

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) (دیوان إمام الشافعي) عبدالرحمن المصطاوي.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**من لم ير العلم أغلى    من كل شيء يصاب**
**فلــيس يفلح حـتى    يحثى عليه التراب**[1]

هەرووەها چەندین وتەی تری پێشـــینان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت کە بەڕاســـتی ئەوەندە وەسفی فێربوونی زانستی شەرعییان کردووە، دەکرێ لە دوو توێی کتێبێکدا کۆبکرێتەوە، بۆیە بەوەنـدە وازدێنین و خوێنەر ڕەوانەی ســـەرچاوەکان دەکەین بۆ زیاتر شـــارەزا بوون لە گرنگی پێدانی ســـەلەفی ئەم ئومەتە بە فێربوونی زانســـتی شەرعی.

(١) (صــلاح الأمـة في علو الهمة) (٣٩٦/١)، بەڕاســـتی ئەمەش کتێبێکی زۆر نایابە و (٧) بەرگە، وە ئامۆژگاری هەموو موسوڵمانێك دەکەم بیخوێنێتەوە.

(إبن عثيمين) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە شەرحی (رياض الصالحين)ـدا لە بابی (صبر) لەژێر تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ۝٣١﴾ [محمد: ٣١]؛ دەفەرموێت: (وشـەی "المجاهدين" موجاهید بریتیە لەو کەسـەی کە هەوڵ دەدات بۆ بەرزکردنەوەی ئـاینی خوا، جـا موجاهید بەزانستەکەی و موجاهید بە چەکیش دەگرێتەوە، چونکە هەردووکیان موجاهیدن لە پێناوی خوادا. موجاهید بە زانسـتەکەی فێری زانسـت دەبێت و خەڵکی فێردەکات بڵاوی دەکاتەوە و ئەمەش دەکاتە هۆکارێك بۆ باڵادەسـت کردنی شـەریعەتی خوا، ئەمە موجاهیدە ,ئەوەشی کە چەك هەڵدەگرێت بۆ کوشتاری دوژمنانی خوا ئەویش دیسـان موجـاهیـدە لە پێنـاوی خوادا ئەگەر مەبەسـت لە هەردوو جیهـادەکە بەرزڕاگرتنی دینی خوا بێت).[١]

هەروەها لە شوێنێکی تری هەمان کتێبدا سەبارەت بە فەزڵی زانستی شەرعی لە بابی (بيان كثرة طرق الخير)ـدا دەفەرموێت: (کەسی وا هەیە ئارەزووی لە نوێژە و کەسی وا هەیە ئارەزووی لە ڕۆژووگرتنە و کەسی وا هەیە ئارەزووی زۆر خوێندنی قورئانە... کەسـی واش هەیە ئارەزووی لە فێربوونی زانسـتە، جا فێربوونی زانست لەو کاتەی ئێسـتاماندا ڕەنگە باشـترین کارەکانی جەستە بێت لەبەر ئەوەی خەڵکی لەم سـەردەمەی ئێسـتاماندا پێویسـتیان بە زانستی شەرعی هەیە، لەبەر باڵا دەستی نەفامی و زۆری خۆ بە زانازان، ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە زانان بەڵام

(١) بڕوانە (شرح رياض الصالحين) (لا ٨٠)، چاپی (مؤسسة الرسالة ناشرون).

هیچیان پێ نیه)...[1]

پـاشــان دەفەرموێت: (جا لەبەر ئەوەی وای دەبینین کە فێربوونی زانسـت لە مێژوودا باشـترینی ئەو کردەوانەیە کە سوودی بۆ خەڵکی هەیە، باشترە لە بەخشین و باشترە لە جیهاد، بەڵکو لە حەقیقەتدا جیهادە، لەبەر ئەوەی خوا (سبحانە وتعالی) بە هـاوتـای جیهادی داناوە لە پێناو خوادا و بەڵگەی ئەوەش فەرمایشـتی خوای گەورەیە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً﴾ واتە: نـابێـت ئیمانداران هەموویان بەجـارێ بـڕۆن بـۆ جیهـاد، ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ﴾ واتە: کۆمەڵێـك دادەنیشـێت بۆ ئەوە دانیشـتوون کە ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ [التوبة: ١٢٢]؛ جا خوای گەورە فێربوونی زانستی بە هاوتای جیهاد داناوە لە پێناو خوادا).

پاشان جەخت دەکاتەوە و دەفەرموێت: (گرنگـ ئەوەیە کە ڕێگاکانی چاکەکردن زۆرن و باشـترینیان ئەوەی کە من وای دەبینیم پاش ئەو فەرزانەی کە خوا فەرزی کردووە بریتییە لە فێربوونی زانسـتی شـەرعی، لەبەرئەوەی ئێمە لەم ڕۆژگـارەدا پێویستمان پێیەتی).[2]

(١) هەمان سەرچاوە (لا ٣٠٢-٣٠٣) بەدەستکارییەوە.

(٢) نازانرێت ئەم وتەیە هی ساڵی چەندە، بەڵام خودی شێخ لە ساڵی (١٤٢١ك) وەفاتی کردووە.

# بەشی یەکەم[1]

## ئادابەکانی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەیدا پێش دەرسەکە

لێرەدا هەندێك ئاداب هەیە پێویستە فێرخوازانی زانستی شەرعی لە خۆیاندا جێبەجێی بکەن پێش ئەوەی بچنە خزمەت مامۆستاکەیان بۆ وانە خوێندن، لەوانە:

**مامۆستا فێرکار و پەروەردەکارە:**

سەرەتا پێویستە لەسەر فێرخوازی زانستی شەرعی بە چاوی فێرکار و پەروەردەکارەوە سەیری مامۆستاکەی بکات و ئەمەش لە گرنگترین ئادابەکانی فێرحوازی زانستی شەرعییە، کە وای دابنێ مامۆستاکەی فێرکارە و زانستی فێردەکات و پەروەردکارە و پەروەردەی دەکات. فێرخوازیش ئەگەر لەم دوو ئەرکەدا متمانەی بە مامۆستاکەی نەبێ، ئەوە سوودی ئەوتۆی لێ نابینێت.

**ملکەچبوون بۆ ئامۆژگاریی مامۆستاکەی:**

پێویستە لەسەر فێرخواز ملکەچ بێت بۆ ئامۆژگاریەکانی مامۆستاکەی و هەوڵی ڕازیکردنی بدات ئەگەر پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی خۆشی بێت، هەروەها لە هەموو کارەکانیدا ڕاوێژی پێ بکات و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات و لە ڕاوبۆچوونی مامۆستاکەی دەرنەچێت نە بەدڵ نە بە زمان.

هەندێ لە زانایان فەرموویانە (هەڵەی مامۆستا بۆ فێرحواز باشترە لە ڕاستیی

(١) ئەم بەشەی یەکەمە هەمووی لە کتێبی (آداب حلية الطالب مع الشيخ) ی (خالد بن خليل بن إبراهيم الزاهدي)یەوە وەرگیراوە، ئەوەشی لەم کتێبەوە وەرم نەگرتبێت ئەوا ئاماژەم بۆ سەرچاوەکەی کردووە.

خۆی).

جـا له بەســـەرهـاتی (موســـی) و (خضـــر) ســـەلامی خوایـان لەســـەر بێت ئاگادارکردنەوە سەبارەت بەمە هەیە.

**له گەورەڕاگرتنی زانست گەورەڕاگرتنی مامۆستایە:**

(الزرنوجي) دەفەرموێت: (بەڕاســـتی فێرخواز زانســـت بەدەســـت ناهێنێت و سوودی لێ نابینێت تەنها بەگەورە ڕاگرتنی زانست و پەیڕەوانی نەبێت، هەروەها بە گەورە ڕاگرتنی مامۆستا و ڕێزگرتنی).

ئینجا له گەورە ڕاگرتنی زانســت گەورە ڕاگرتنی مامۆستایە، پێشەوا علی (ڕەزای خوای لێ بێـت) فەرموویەتی: (من بەندە "کۆیلە"ـــــــی ئەو کەســـەم کە یەك پیتم فێردەکات، ئەگەر بیەوێ دەیفرۆشێ و ئەگەر بیەوێ ئازادی دەکات و ئەگەر بیەوێ دەیهێڵێتەوە و دەیکاتە بەندە"کۆیلە").

لەبەر ئەوە بەڕاسـتی سـەلەف (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ڕێزی مامۆستاکانیان گرتوون و حەقی مامۆستایان زانیوە.

دەگێردرێتەوە له هەندێ پێشـینانەوە کە کاتێك ڕۆشـتوون بۆ لای مامۆسـتاکەی شـتێکی کردووە بە خێر(صـدقة) و وتوویەتی: (پەروەردگارە عەیبی مامۆستاکەم لێ بشاریتەوە بۆ ئەوەی بەرەکەتی زانستەکەم لا بمێنێتەوە).
هەروەهـا (ربیع) ڕەحمەتی خوای لێبێت ســـوێند دەخوات و دەڵێت: (ســـوێند بەخوا نەموێراوە ئاو بخۆمەوە لە کاتێکدا شافعی سەیرم بکات لەبەر هەیبەتی).

**فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەی وەکو نەخۆش وایە لەگەڵ پزیشکەکەی:**

لە ئادابەکانی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەی ملکەچبوونە بۆ مامۆستاکەی لە هەموو کارەکانیدا و نابێت لە فەرمان و ڕاوبۆچوونی دەرچێت، بەڵکو دەبێت لەگەڵیدا وەکو نەخۆش بێت لەگەڵ پزیشکێکی لێهاتوودا، جا ڕاوێژی پێبکات لەوەی کە مەبەستێتی و خۆی نزیك بکاتەوە لە خوا (پەرستش بکات) بە خزمەتکردنی و بزانێت کە زەلیلی بۆ مامۆستاکەی سەربەرزییە و ملکەچی بۆی شانازییە و خاکەڕایی(تواضع) بۆی بەرزییە.[١]

**خاکەڕایی (تواضع) لەگەڵ مامۆستادا:**

پێشەوا (احمد) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەگەڵ ئەو ڕێزە زۆرەی و گەورەیی پلە و پایەی بە (حلف الاحمر) دەفەرموێت (دانانیشم مەگەر لەبەردەستتدا نەبێت، فەرمانمان پێ کراوە کە خاکەڕا (متواضع) بین بۆ ئەو کەسەی کە لێیەوە فێر دەبین).

هەروەها وتراوە کە لۆمەی پێشەوا شافعی کراوە لەسەر خاکی بوونی بۆ زانایان، ئەویش فەرموویەتی:

**أهين لهم نفسي وهم يكرمونها ولن تكرم النفس التي لا تهينها**

جا ئێمە بە گشتی فەرمانمان پێ کراوە کە خاکی بین و لووت بەرز نەبین، کەواتە بەرامبەر زانایان و مامۆستایانی فێرکار لەپێشترە، هەروەها خاکی بوون لە ڕەوشتی

(١) ئەم ووتەیە زێدەڕەوی تێدایە، چونکە ڕێزگرتن لە مامۆستا جیاوازە لەزەلیلی و ملکەچی دەربڕین. (م.احسان برهان الدين).

پێغەمبەرانە (سـەڵات و سـەلامی خوایان لەسـەر بێت)، هەروەها لە گرنگترین هۆکارەکانی بەرزبوونەوە و عیزەتە، وەکو ووتراوە:

**تواضع تكن كالنجم لاح لناظر — على صفحات الماء وهو رفيع**
**ولا تكن كالدخـان يرفع نفسه — إلى طبقات الجو وهو وضيع**

**بۆ فێربوونی زانست پێویستە بەدوایدا بگەڕێیت نەك چاوەڕێی بکەیت:**

لەو ئـادابانەی کە پێویسـتە فێرخواز ڕەچاویان بکات ڕۆشـتنە بۆ دانیشـتنی (مجالس)ـی ئەهلی زانسـت، جا ئەم ئەدەبە وەرگیراوە لە فەرموودەکەی جبریل (سـەلامی خوای لێبێت)، پێشـەوا (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت ئەفەرموێت: (بَيْنَما نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْـدَ رسُـولِ اللـه ﷺ إذْ طَلَعَ عَلَيْنَـا رَجُـلٌ...)؛ واتە: (کـاتێـك ئێمە دانیشـتبووین لای پێغەمبەری خوا ﷺ پیـاوێـك دەرکەوت بۆ لامـان....) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زانست پێویستە بچیتە خزمەتی، چونکە ڕێزگرتن لە زانست ئەوەیە کە بچیتە خزمەتی نەك ئەو بێت.

جا لەبەر ئەوە پێویسـتە لەسـەر زانایان و مامۆستایان خۆیان بەعیزەت بگرن و نەفسـی خۆیـان بەرز ڕاگرن لە چوون بۆلای فێرخواز، لەبەر ئەوەی ئەو کـارە سـوککردن و بێ ڕێزیکردنە بە زانسـت، ئەمە تەنها لە یەك حاڵەتدا کارێکی ئاساییە کە مامۆسـتاکە حاڵی ئاسـایی نەبێت و شـوێنێکی دیاری کراوی نەبێت بۆ دەرس وتنەوە، یاخود فێرخوازەکە پێشـتر مامۆسـتای مامۆستاکەی بوبێت و حەقی لەسەر مـامۆسـتـاکەی هەبێـت و مـامۆسـتـاکەش وەکو وەفایەك بڕوات بۆ لای، یاخود فێرخوازەکە دایك یان باوکی مامۆستاکە بێت والله اعلم.

پێشـەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاتێك گەڕایەوە بۆ بوخارا -شوێنی لەدایـك بوونی خۆی- والیی ئەو شـــارە داوای لێکرد بێت بۆ لای و هەردوو کتێبی (صحیح)ـەکەی و (مێژوو)ـەکەی بەسەردا بخوێنێت، ئەویش بەنێدراوەکەی والیی ووت: (پێی بڵێ: من زانست زەلیل ناکەم و هەڵیناگرم بۆ بەردەرگای دەسەڵاتداران). جەنابی والیش فەرمانیدا بەدەرکردنی لە بوخارا، ئەویش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەوێ دەرچوو بەرەو گوندی خەرتەنك و لەوێدا مایەوە تا وەفاتی کرد. (١)

**ئامادەبوون لە شوێنی خوێندنەکە پێش هاتنی مامۆستاکە:**

لە ئادابەکانی فێرخواز ئەوەیە کە هەوڵ بدات پێش هاتنی مامۆستاکە لە شوێنی دەرس ئـامـادە بێـت، ئەگەر لەبەر دەرگـای مـاڵیـان چـاوەڕوانی بکەی بۆ ئەوەی دەرچێت و لەگەڵیدا بڕۆی بۆ شـوێنی دەرس خوێندنەکە ئەوە باشـترە ئەگەر ئاسان بوو، خۆیشـــی بەدوور بگرێـت لەوەی کە دوابکەوێت لە ئامادەنەبوون یان داوا لە مامۆســتا بکات چاوەڕێی بکات! چونکە بکەری ئەم جۆرە کارە بەبێ پاســاوێکی شەرعی ئەوە بێ گومان خۆی تووشی تورە بوونی مامۆستاکەی کردووە.

هەروەهـا (محمـد بن قدامة) دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ( گوێم لە شـــوجاعی کوڕی موخللەد بوو دەیفەرموو گوێم لە ئەبو یوسف بوو دەیفەرموو: کوڕێکم مرد، جا ئامادەی کفن کردن و ناشـــتنی نەبووم و بەجێمهێشـــت لای دراوســـێ و کەســـە نزیکەکانم، لەترسـی ئەوەی شتێکم لای (ئەبو حەنیفە) لە دەست بچێت کە هەرگیز

(١) تدريب الراوي (لا ٦٤٠).

داخی لەدڵم دەرنەچێت).[1]

**مۆڵەت وەرگرتن لە چوونە ژوورەوە بۆ لای مامۆستا:**

دیسان لە ئادابەکانی فێرخواز ئەوەیە کە نابێت بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بچێتە ژوورەوە بۆلای مامۆستاکەی مەگەر لە دانیشتنی گشتیدا بێت.

جا ئەگەر داوای مۆڵەتی کرد بەشێوەیەك کە مامۆستا ئاگاداربوو و مۆڵەتی نەدا ئەوە پێویستە بگەڕێتەوە و دووبارە داوای مۆڵەت نەکاتەوە.

ئەگەر گومانیشی لە ئاگاداربوونەوەی مامۆستا هەبوو ئەوە لەسێ جار زیاتر داوای مۆڵەت نەکات یان سێ جار زیاتر لە دەرگا نەدات و پێویستە بە ئەدەب و لەسەرخۆبێت مەگەر شوێنەکە دووربێت ئەویش بەئەندازەی ئەوەبێت کە ببیسترێت، ئەگەر کۆمەڵێکیش بوون پێویستە شارەزاترینیان و بەتەمەنترینیان پێش بخەن لە چوونە ژوورەوە و سەلامکردن لە مامۆستا پاشان باشتر و باشتر.

**چۆنیەتی چوونە ژوورەوە بۆ لای مامۆستا:**

پێویستە کاتێك فێرخواز دەچێتە ژوورەوە بۆ لای مامۆستاکەی یان لای دادەنیشێت دڵی خاڵی بێت لە شتە سەرقاڵکەرەکان و بیر و هۆشی ئامادەبێت، نەك لە حاڵەتی وەنەوز (خەوتن) یان توڕەیی یان برسێتیەکی زۆر یان تینوێتی یان لەو شێوانەدا بێت، بۆ ئەوەی دڵخۆش بێت بەوەی کە دەوترێت و تێبگات لەوەی کە دەیبیستێت، ئەگەریش ئامادە بوو لە شوێنی مامۆستاکەی و مامۆساکەش لەوێ

(١) صلاح الأمة في علو الهمة (٢١٧/١)، د.سيد بن الحسين العفاني.

نەبوو پێویســتە چاوەڕێی بکات بۆ ئەوەی دەرســێکی لەدەســت دەرنەچێت، چونکە هەر دەرسـێك کە لە دەست دەچێت قەرەبووی نییە. هەروەها پێویستە بە شێوەیەکی جوان و تەواوە بچێتە خزمەت مـامۆســـتـاکەی، خۆی پـاك کردبێتەوە و ســـیواکی کردبێت و سمێڵی کورت کردبێتەوە و نینۆکی گرتبێت و خۆی بۆن خۆش کردبێت[١]، پاشـان سـەلام لە ئامادەبووان بکات بەشـێوەیەك کە هەمووان بیبیستن، وە پێویستە مامۆستاکەی تایبەتمەند بکات بە زیاتر ڕێزگرتنی.

علی (ڕەزای وای لێ بێت) دەفەرموێت: (لە مافەکانی مامۆسـتا لەسەرت ئەوەیە کە ســـەلام بکەیت لە خەڵکی بەگشـــتی، بەڵام مامۆســـتاکەت تایبەتمەند بکەیت و لەبەرامبەری دانیشـــی و لە حزمەتیـدا ئـامـاژە نەکەیـت و چاو نەبڕیتە غەیرە ئەو، هەروەها نەڵێی فلان کەس بە پێچەوانەی تۆوە وای وت، غەیبەتی کەسی لانەکەیت، نەکەویتە بەر کراســـەکەیدا و زۆری لێ نەکەی ئەگەر نەیتوانی و تێر نەبیت لەزۆر هاوڕێیەتی کردنی، چونکە ئەو وەکو دارخورما وایە پێویســـتە چاوەڕێی بکەیت تاکو بزانیت کەی شتێکی لێ دەکەوێتە خوارەوە بۆت).

### ڕەچاوکردنی حاڵی مامۆستا:

پێویستە لەسەر فێرخواز داوا لە مامۆستاکەی نەکات لەکاتێکدا دەرسی پێ بڵێت کە گران بێت لەسەر مامۆستاکەی، هەروەها کاتێکی تایبەتی لێ داوا نەکات بەتەنها بۆخۆی، بەڵام ئەگەر مامۆستاکەی خۆی کاتێکی تایبەت یان دیاریکراوی دانا لەبەر (عذر)ــێك یان لەبەر بەرژەوەندییەك ئەوە ئاساییە.

---

(١) ئەنجامدانی ئەم کارانە پێویستی بەبەڵگەی شەرعییە! (م.احسان برهان الدین).

یان ئێستا لەم سەردەمە ڕەنگە هەندێ لە فێرخوازانی زانستی شەرعی لەبەر هەژاری و دەست کورتی سەرقاڵی هەندێ کاری تر بن بۆ پێویستی بژێوی خۆیان یان خێزان و دایك و باوکی، ئەوە ئاساییە مامۆستا کاتێکی تایبەتی بۆ دابنێت ئەگەر مامۆستاکەی کاتی هەبێت و ڕێ لە بەرنامەکانی تری ڕۆژانەی نەگرێت. والله أعلم.[1]

## ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگ:

هەرکاتێ فێرخواز چووە ژوورەوە بۆ لای مامۆستاکەی جگەلە کۆڕی گشتی، بینیی کەسێکی لایە و گفتوگۆی لەگەڵ دەکات، گفتوگۆکەیان بڕی - بێ دەنگ بوون لەبەر هاتنی فێرخوازەکە - یان چوونە ژوورەوە و مامۆستا خۆی بەتەنها نوێژی دەکرد یان یادی خوای دەکرد یان دەینووسی یان دەیخوێندەوە و وازی لەوە هێنا یان بێ دەنگ بوو و لەگەڵ فێرخوازەکە قسەکردنی دەستپێنەکرد، فێرخوازەکە دەبێت سەلامی لێ بکات و خێرا بێتە دەرەوە، مەگەر مامۆستا خۆی هانی بدات لەسەر مانەوە، جا ئەگەر مایەوە درێژەی پێ نەدات مەگەر مامۆستا خۆی فەرمانی پێ بکات.

## بەئەدەبەوە دانیشتن لەبەردەم مامۆستادا:

لەنیشانەکانی ڕێزگرتنی مامۆستا ئەوەیە کە فێرخوازان وەکو شێوەی فێرخواز دابنیشن، نەك دانیشتنی مامۆستایانە، جا نابێت لاقی درێژ بکات و نابێت بەدەست

(١) ئامادەکار.

ئاماژە بکات و نابێت پاڵ بداتەوە و نابێت پێبکەنێت و گاڵتە بکات.

حەمدانی کوڕی عەلی ئەسبەهانی دەڵێت: (لای شەریك بووم، یەکێك لە کوڕەکانی خەلیفەی موسوڵمانان (المهدي) هات بۆ لای و پاڵی دا بەدیوارەکەوە و پرسیاری لێدەکرد سەبارەت بەفەرمووده، ئەویش لای لێ نەدەکردەوە، جا پرسیارەکەی دووبارە دەکردەوە، ئەویش گوێی پێ نەدا، کوڕەکەی (المهدي) ووتی: دیارە تۆ بە مداڵانی خەلیفە بێ ڕێزی دەکەی. ئەویش فەرمووی: نەخێر، بەڵام زانست زۆر بەڕێزترە لای ئەهلی خۆی لەوەی کە بەفیڕۆ بدرێت). حەمدان دەڵێت: (کوڕەکەی (المهدي) لەسەر ئەژنۆ دانیشت پاشان پرسیاری لێ کرد، ئەویش فەرمووی: بەم شێوەیە داوای زانست دەکرێت).

دەبێت فێرخواز گوێ لەمامۆستاکەی بگرێت و بەهەموو ئەندامەکانی ڕووی تێ بکات لەکاتی گوێگرتن لەمامۆستا سەیریشی بکات و پەیوەست بێت بەووتەکەیەوە بەشێوەیەك پێویستی بەدووبارەکردنەوەی قسەکەی نەبێت بۆ جاری دووەم> هەروەها بەرنەکاتە ئەملا و ئەولاوە بەبێ زەرورەت و سەیری لای ڕاستی یان لای چەپی یان سەرەوەی خۆی یان خوارەوە نەکات بەبێ پێویستییەك، بەتایبەتی لەکاتی باسکردنی مامۆستا بۆ ئەو، یان لەکاتی قسەکردنی لەگەڵ ئەودا، جا نابێت سەیری هیچ لایەك بکات مەگەر ئەو نەبێت و تێك نەچێت لەبەر ژاوەژاوێك کە دەیبیستێت، فوو بەدەمی نەکات و گاڵتە بەدەستەکانی یان قاچەکانی نەکات یان جگە لەمانە ئەدامەکانی جەستەی و دەست نەخاتە ناو ڕیشی یان ناودەمی یاری پێ بکات لەلووتی یان شتێك لەلووتی دەربکات، هەروەها دەمی بەباوێشك نەکاتەوە و

بەئامادەبوونی مامۆســـتا پاڵ نەداتەوە دیوارێك یان ســـەرینێك و پشـــت یان لا لە مامۆستا نەکات.

## بەشی دووەم[1]

## ئادابەکانی فێرخواز لەگەڵ مامۆستا لەکاتی وانەدا

فێرخواز نابێت بەقسەکردنی قسەکەر قسە لەگەڵ مامۆستاکەیدا بکات، وەکو بڵێت: (تۆ یان جەنابت)، بەڵکو دەبێت بڵێت مامۆستاکەم ئێوە چ دەڵێن دەربارەی فلان شت؟ یان جەنابتان چ دەڵێن؟ و هاوشێوەی ئەمانە. هەروەها لەئامادەبوونی خۆشیدا نابێت بەناوی خۆیەوە بانگی بکات مەگەر پەیوەستکردنی بەشێك کە هەستی گەورەیی تێدابێت بۆ مامۆستاکەی، وەکو شێخ وای فەرموو، بەم شێوەیە وەکو ئەوەی (ابن حجر) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) پرسیار لەمامۆستاکەی (حافظ العراقي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەکات و دەڵێت: **(ما يقول سيدي في الحد الذي إذا بلغه الطالب في هذا الزمان إستحق أن يسمى حافظا؟...)**.[2]

هەروەها نابێت لەدوورەوە بانگی بکەی مەگەر لەحاڵەتی پێویست نەبێت وەکو مەترسییەك ڕوو لەمامۆستا بکات یان چاڵێک لەبەردەمیدابێت و مامۆستا پێی نەزانێت یان نزیك بێت ئۆتۆمبێل لێی بدات و ئەو ئاگای لێ نەبێت یان هەر مەترسییەکی تر.

وەکو (إبن عثيمين) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی (حلية الطالب العلم)

---

(١) ئەم بەشی دووەمەش هەر لەهەمان سەرچاوەوە وەرگیراوە و ئەوەشی لەسەرچاوەی ترەوە وەرگیرابێت ئەوا ئاماژەم پێ کردووە وەك دەبینی.

(٢) (تدريب الراوي): سيوطي.

وا دەفەرموێت.[1]

هەروەها پێویستە لەسەر فێرخواز بەمامۆستاکەی نەڵێت تۆ ئەوە و ئەوەت ووت، یـان لەوانەی ڕابردوودا ئەوە و ئەوەت ووت، چونکە ئەم جۆرە قســەکردنە لەگەڵ مـامۆســتـادا بێ ئەدەبی تێـدایە، بەڵکو دەبێـت بوترێـت ئەوەمـان ووت، یان ئەوە بەسـەرمان تێپەڕی، یان دەبێت بەشـێوەی کۆ (جمع) قسـەی لەگەڵدا بکەی، وەکو: (دەربـارەی ئەوە چ دەڵێن؟) یـان ڕاتـان چییە دەربـارەی ئەوە و ئەوە؟) یـان ڕەزای خواتـان لێبێ واتـان فەرموو)... هەروەهـا نابێت بڵێت: بۆ؟، لەبەرچی؟، نەخێر، کێ ئەمەی نەقڵ کردووە؟، شوێنەکەی لەکوێیە؟ .... هتد، وە هاوشێوەی ئەمانە.

## پێشنەکەوتنی مامۆستا لە شەرحکرنی بابەتێك یان وەڵامدانەوەی پرسیارێك:

پێویسـتە لەسـەر فێرخواز پێش مامۆسـتاکەی نەکەوێت لەشەڕحکردنی بابەتێك یـان وەڵامـدانەوەی پرســیـارێك و پێشــبڕکێی لەگەڵدا نەکات و زانینی خۆی یان درککردنی بۆ بابەتەکە پێش مامۆسـتاکەی دەرنەخات. ئەگەر مامۆسـتا لەسـەرەتادا داوای لێ کرد ئەوا ئاسـاییە و هەروەها پێویستە قسە بەمامۆستاکەی نەبڕێت - هەر قســەیەك بێت -، دەبێت پێش قســەی نەکەوێت یان لەگەڵ قســەکردنی مامۆســتا ئەویش قسـەبکات، وە قســە لەگەڵ کەسـێکی تردا نەکات کاتێك مامۆسـتا قسـە دەکات، بەڵکو ئارام بگرێ تاوەکو مامۆستاکەی قسە تەواو دەکات، پاشان ئەو قسە بکات.

---

(١) (شرح حلية الطالب العلم): الشيخ محمد بن صالح العثيمين، (لا ٧٣ - )٧٤، چاپی (مؤسسة المختار).

## چۆنییەتی کتێب یان پەڕە دانەدەست مامۆستاوە:

ئەگەر مامۆستا شتێکی دا بەدەست فێرخوازەوە دەبێت بەدەستی ڕاست وەریبگرێت، ئەگەریش ئەو شتێکی دا بەمامۆستا دەبێت بەدەستی ڕاست پێی بدات، جا ئەگەر پەڕەیەك بوو بیخوێنێتەوە بۆ نموونە نابێت بەلوولکراوی پێی بدات مەگەر بزانێت مامۆستا ئەوە بەباشتر دەزانێت، ئەگەریش کتێبێکی دا بەمامۆستا دەبێت ئامادەبێت بۆ کردنەوەی بەبێ پێویست بوون بۆ کردنەوەی، وە ئەگەر مامۆستا سەیری شوێنێکی دیاریکراو بکات دەبێت شوێنەکەی بۆ دیاری بکات و نابێت هیچ شتێکی بۆ فڕێ بدات وەکو کتێب یان پێنووس یان پەڕە ... هتد، وە نابێت دەستی بۆ درێژ بکات ئەگەر دووربوو لە مامۆستاوە، هەروەها نابێت وابێت کە مامۆستا پێویست بکات دەستی بۆ درێژ بکات بۆ وەرگرتنی یان پێدانی، بەڵکو دەبێت هەستێتە سەرپێ.

## جوان پرسیارکردن کلیلی زانستە:

جوان پرسیارکردن لەتەواوی ئەدەبە و ئەمەش دەبێت یەکێك لەو ئادابانە بێت کە فێرخوازی زانستی شەرعی زۆر ئاگای لێبێت، چونکە فێرخواز لەپێناو ئەوەدا دەخوێنێت و گوێ دەگرێ بۆ ئەوەی تێبگات و پێبگات.

زۆرێك لەهاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) پرسیاریان کردووە لە شتگەلێك کە مەبەستەکە ڕوون نەبووە لایان تاوەکو وەڵامیان دراوەتەوە، وەکو پرسیارکردنیان سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ ٨٢﴾ [الأنعام: ٨٢]؛ فەرموویان

کامامان ســتەم ناکەین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: مەبەســت لە ووشــەی (ظلم) لەئایەتەکەدا (شرك)ـە، وەکو خوا لەسەر زمانی لوقمان دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ [لقمان: ١٣]؛

جوان پرســیارکردن یارمەتی فێربوون دەدات، هەرکەســێ جوان پرســیار بکات فێردەبێــت، لەبەر ئەوە زانــای پــایــابەرز (ابن القیم) (ڕەحمەتی خوای لێبێــت) دەفەرموێت: (زانست شەش پلەی هەیە، یەکەمیان جوان پرسیارکردنە ...).

**نەرمونیانی و لەسەرخۆیی لە کاتی پرسیارکردندا:**

پێویســتە لەســەر فێرخواز لەپرســیارکردن لەســەرخۆبێ لەگەڵ مامۆســتاکەی و ڕەوشــتی جوان بێــت لەگەڵیــدا و بەردەوام دوعــای خێری بۆ بکــات، چونکە ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانی.

(المســتظهر) دەفەرموێت: (ئەدەبی پرســیارکەر لەهۆکارەکان بەســوودترە)، جا ئەدەب باشترین هۆکارە بۆ دەرکردنی زانستی مامۆستا.

(ابن جریج) دەفەرموێت: (ئەوەی کە لە (عطاء)ـــم دەرکرد نەمدەتوانی دەری بکەم مەگەر بەنەرمونیانیم نەبوایە لەگەڵیدا).

کەواتە دەبێت پرســـیارکردن لەســـەرخۆیی و بەڕێزەوە بێت و هەروەها بەخاکی بوون و گەورە گرتنەوە بێت، بەبێ درێژە پێدان و بێزارکردن و ... هتد.

### هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ پرسیارکرن:

هەروەها پێویستە لەسەر فێرخواز پرسیار لەمۆستاکەی نەکات سەبارەت بەشتێك کە لەجێی خۆی نەبێت، هەروەها زۆر نەکات لەمامۆستاکەی بەزۆرکردنێکی ناچارکەر، جا پرسیارکردن لەمامۆستاکەی لەکاتی دەست بەتاڵی و بۆشاییدا بەهەل بزانێت و شەرم نەکات لەپرسیارکردن لەوەی کە ڕوون نییە.

### ئەو شتانەی کە پرسیارکردن دەربارەیان ناپەسەندە:

- پرسیارکردن لەوەی کە سوودی دونیا و دینی تێدا نییە.
- پرسیارکردن لەوەی کە لەو کاتەدا پێویستی پێی نییە.
- پرسیارکردن سەبارەت بەبابەتە ئەستەمەکان.
- پرسیارکردن لە هۆی حوکمە پەرستشەکان و حیکمەتەکانیان.
- پرسیارکردن تاپلەی قووڵ بوونەوە و تەکەللوف.
- پرسیارکردن دەربارەی (متشابهات).
- پرسیارکردن دەربارەی ئەوەی کە لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویدا (ڕەزای خوایان لێبێت).

### فێرخواز چی دەکات کاتێك مامۆستاکەی هەڵە دەکات؟

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانرێت کە مامۆستاکەی وەکو هەموو کەسێکی تر مرۆڤە و هەڵە دەکات و دەشپێکێ، وە ئەگەر هەڵەیەکی کرد دەبێت بەئەدەبەوە ئاگاداری بکاتەوە و بەنەرمونیانی و لەسەرخۆیی بێت، پێی نەڵێت هەڵەت کرد! یان وانییە کە

تۆ بۆی دەچیت، بەڵكو بەدەستەواژەیەكی جوان و پڕ لە ئەدەب دەبێت پێی بوترێت، بەشێوەیەك مامۆستا هەست بكات كە هەڵەی كردووە.

خەتیبی بەغدادی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەرفەرمویێت: (أبو عبدالله محمد بن الـدامغـاني بۆی بـاســكردم فەرمووی گوێم لە قـازی أبا عبدالله الصــبمري بوو دەیفەرموو: ڕۆژێك أبو بكر قازي الخوارزمي وانەی پێ دەووتینەوە و باسی شتێكی كرد ســەبـارەت بە (محمـد بن الحســن) كە لەو بابەتەدا بووین، محمد لە كتێبی (الجامع لصـغیر) دا پێچەوانەی ئەوەی أبو بكر الخوارزمي فەرموبوو). جا كاتێك لە وانەكە بووینەوە: وازم لەپێداچوونەوەی وانەكە هێنا لەگەڵ هاوڕێكانمدا و چووم بۆ لای أبو بكر كە چووبووە ماڵەوە و كتێبی (الجامع)ی (محمد بن الحسن)ـــم لەگەڵ بوو، داوای مۆڵەتم لە أبو بكر كرد، مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی پێـدام، منیش چوومە ژوورەوە و سـەلامم لێ كرد و پاشـان پێم ووت: لێرەدا بابەتێك هەیە شتێكی تێدایە لام ڕوون نییە و پێویســتم بەخوێندنەوەی هەیە بەســەر شــێخدا، فەرمووی بخوێنە. منیش لەپێش ئەو بـابەتەوە خوێندمەوە كەلەپێناویدا هاتبووم تا تەواوم كرد و پێیـدا تێپەڕیم. ئەوەبوو أبو بكر فەرمووی: لەوانەكەدا ســەبـارەت بە (محمـد بن الحسن) شتێكمان باس كرد، بەڵام دەقەكەی لێرەدا پێچەوانەی ئەوەیە كەباسمانكرد و بەو شــێوەیە (ڕاســتییەكەی بۆ باســكرد)، كەواتە هاوڕێكانت فێربكە بۆ ئەوەی بیریان بكەوێتەوە و لەسەر ڕاستییەكەی تێ بگەن.

كەواتە پێویستە لەسەر فێرخواز بەشێوەیەك هەڵەی مامۆستاكەی ڕاست بكاتەوە كە لەوپەڕی ئەدەب و جوانیدا بێت و ئەگەر هەر نەیتوانی بەشـێوەیەكی ڕاستەوخۆ

پێی بڵێت ئەوا بەشـــێوەیەکی نـاڕاســـتەوخۆ پێی بڵێـت وەکو ئەوەی لەپەڕەیەکـدا ڕاسـتییەکە بەبەڵگەی تەواوەوە ڕوون بکاتەوە و بینێرێت بۆ مامۆسـتاکەی و ئەگەر مـامۆســـتاکەی هەر ملی نەدا بۆ حەق ئەو لەو کاتەدا بەگوێی ناکرێت، چونکە **(لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)**، بەڵام هەر ڕێز و ئەدەب نواندن لەگەڵیدا پێویستە لەسەر فێرخواز.[١]

(١) ئامادەکار.

## بەشی سێیەم[1]

## ئادابەکانی فێرخواز بەرامبەر مامۆستا لەپاش وانەکە

لێرەدا هەندێ ئادابی تر هەن کە پێویستە لەسەر فێرخواز ڕەچاویان بکات بەرامبەر مامۆستاکەی لەپاش وانەکە یان لەکاتێکدا کە خوێندنی لای ئەو مامۆستایە نەماوە، ئیدی بەهەر هۆکارێك بێت، لەوانە:

### لەبیرنەکردنی مافەکانی مامۆستا:

هەندێ ئادابی تر هەن بۆ فێرخواز زانستی شەرعی بەرامبەر مامۆستاکەی لەدوای وانەکەی پێویستە لەسەری پابەند بێت پێوەی و ڕەچاویان بکات، لەوانە: حەق و فەزڵ و چاکەی مامۆستاکەی بەسەریەوە لەبیر نەکات.

(شعبە) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (ئەگەر فەرموودەم لەهەر کەسێك ببیستایە دەبوومە کۆیلەی تاکو لەژیانا بوایە).

### بەرگریکردن لەمامۆستا و وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی غەیبەتی دەکات:

لە ئادابەکانی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەی ئەوەیە کە جەنابی مامۆستا بەگەورە بگرێت و وەڵامی غەیبەتی بداتەوە و لەپێناویدا تووڕە ببێت، ئەگەریش نەیتوانی

---

(١) ئەم بەشی سێیەمەش هەر لەهەمان کتێبەوە وەرمگرتووە، ئەگەر شتێکم لەسەرچاوەیەکی ترەوە وەرگرتبێ ئەوا ئاماژەم پێ کردووە.

هەستێ و ئەو دانیشتنە بەجێ بهێڵێت.

## چۆنییەتی هەستان دانیشتنی فێرخواز لەکاتی ئامادەبوونی مامۆستاکەی:

هەروەها پێویستە لەسەر فێرخواز دانەنیشێت کاتێك مامۆستاکەی هەستابێ و لەکاتی هەستانی مامۆستاکەیدا هەستێت، هەروەها ڕانەکشابێت و مامۆستاکەی هەستابێت یان دانیشتبێت، بەڵکو بەڕەهایی واتە هەرگیز لەخزمەتیدا ڕانەکشێت، مەگەر لەکاتی خەوتندا نەبێت، مامۆستاکەیشی مۆڵەتی دابێت، بەڵکو باشتر وایە نەخەوێت تاکو مامۆستاکەی دەخەوێت، مەگەر مامۆستا خۆی فەرمانی پێ بکات و ئەویش گوێڕایەڵی بکات، هەروەها پێڵاوەکانی (نەعلەکان)ی بۆ دابنێت ئەگەر ئەمە قورس نەبوو لەسەر مامۆستاکەی و مەبەستی لەهەموو ئەمانەش نزیککبوونەوە بێت لەخوای گەورە.

## چۆنییەتی ڕێکردنی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەی:

ئەگەر فێرخواز لەگەڵ مامۆستاکەیدا ڕێی دەکرد دەبێت لەپێشیەوە نەڕوات، مەگەر شەو بو لەپێشیەوە بڕوات و ئەگەر ڕۆژ بوو لە پشتییەوە بڕوات، مەگەر حاڵەتەکە پێچەوانەی ئەوە بخوازێت وەکو قەرەباڵغی و مەترسی ... هتد. ئەگەر لەقەرەباڵغیدا ڕێیان دەکرد دەبێت ماۆستاکەی بپارێزێت بەجەستەی خۆی، یان لەپێشیەوە یان لەپاشیەوە، ئەگەریش لەپێشیەوە ڕێی دەکرد دەبێت ناوە ناوە بەرکاتە لایەوە، جا ئەگەر خۆی بەتەنها بوو لەگەڵ مامۆستاکەی و قسەیان دەکرد دەبێت لەلای ڕاستیەوە بێت و لای چەپی بۆ چۆڵ بکات بەڵکو مامۆستاکەی تفێك بکات

یان کۆکەیەك بکات. هەروەها کەسانی نزیکی چواردەوری بەمامۆستاکەی بناسێنێت و خۆی بپارێزێت لەڕێگا تەسك کردنەوە لەمامۆستاکەی، وە سێبەری بۆ بکات یان لای سێبەری بۆ چۆڵ بکات لەکاتی هاویندا و لای خۆری بۆ چۆڵ بکات لەکاتی زستاندا، هەروەها نەچێتە نێوان مامۆستاکەی و ئەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ دەکات، ئەگەر مامۆستاکەی لەگەڵ کەسێکدا قسەی دەکرد ئەم دوا بکەوێت و گوێیان لێ نەگرێت، مەگەر خۆیان پێی بڵێن فەرموو جەنابیشت بەشداربە لەقسەکردن لەگەڵماندا.

## فێرخواز چی دەکات کاتێك مامۆستاکەی لەڕێگادا دەبینێت؟

ئەگەر فێرخواز مامۆستاکەی لەڕێگادا بینی دەبێت پێش ئەو سەلامی لێ بکات و بچێت بۆ لای ئەگەر دووریش بێت، نابێت لەدوورەوە بانگی بکات یان لەدوورەوە سەلامی لێ بکات یان لەپشتەوە، بەڵکو نزیك دەبێتەوە لێی و پاشان سەلامی لێ دەکات.

## نەپچڕاندنی پەیوەندی و چاکەکردن لەگەڵ مامۆستادا تا کۆتا ساتی ژیانی:

پێویستە لەسەر فێرخوازی زانستی شەرعی سەردانی مامۆستاکەی بکات و چاکەی لەگەڵدا بکات تا لەژیاندا مابێت بەسەردانیکردنی وازی لێ نەهێنێت و لە خزمەتکردنی مامۆستاکەی بەردەوام بێت.

لەو بەسەرهاتە خۆشانەی کە لەم بوارەدا دەگێردرێتەوە ئەوەیە کە (الزجاج) زانای (نحو)ی بەناوبانگ بەردەوام سەردانی (المبرد)ی مامۆستای دەکرد

و چاكەی لەگەڵدا دەكرد، جا (الزجاج) پلە پلە لەپۆستەكەدا بەرز دەبوویەوە تاوەكو گیشـتە خزمەتكردنی وەزیر (قاسـمی كوڕی عبیداللەی كوڕی سـلیمان)، كاروبار سـەرقاڵی كرد لەچـاكەكردن بەرامبەر مـامۆسـتـاكەی و تـا مـاوەیەك لێی دابڕا، (الـمبرد)ـــیش بەسـاڵا چووبوو، پێویسـتی بەو یـارمەتییە هەیە و بـانگی (الزجاج)ـــی كرد و پرسیاری لێ كرد: ئایا حەسوودی (ئیرەیی) مرۆڤ لەلایەن خۆیەتی؟ ووتی: نەخێر، (المبرد) فەرمووی: كەواتە مانای فەرموودەی خوا چییە كە دەفەرموێت: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم ﴿١٠٩﴾﴾ [البقرة: ١٠٩]؟

(الزجاج) نەیتوانی وەڵام بداتەوە، جا (المبرد) پێی ووت: كەواتە بزانە زۆر شت لەسەرت ماوە بیزانی و فێر ببی.. (الزجاج)ـــیش گەڕایەوە بۆ چاكەكردن لەگەڵ مامۆستاكەی.

### كۆتای ئادابەكان: ئەدەب نواندان لەگەڵ مامۆستادا دوای مردنی:

پێویسـتە لەسـەر فێرخواز تـا مامۆسـتاكەی لەژیاندا ماوە دوعای خێری بۆ بكات و چاودێری منداڵ و نزیكەكانی بكات، وە پاش مردنی زوو زوو سـەردانی گۆڕەكەی بكات و داوای لێخۆشبوونی بۆ بكات و (صدقە)ـــی بۆ بكات و شوێن پێی بگرێـت لەئاداب و ڕەوشـتەكانی و داب و نەریتی لەزانسـت و وانە ووتنەوە ڕەچاو بكات و ئیقتیدا بكات بە جووڵە و دانیشـتنەكانی و هەڵسـوكەوتی لەداب و نەریتەكـانی تردا، ئەمەش لەكـاتێكـدا كە ئەگەر پێچەوانەی شـەرع نەبوو ئەوا:

(لا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)[1].

(١) مختصر صحيح مسلم (١٢٣٣) للمنذري.

## بەشی چوارەم

## هەندێ ئادابی تر کە نابێت فێرخوازی زانستی شەرعی لێی بێئاگابێت

**١- زانســـت عیبـادەتە:** بنەمای ســـەرەکی هەموو ئادابەکان ئەوەیە فێرخوازی زانســـتی شـــەرعی بزانێت کە فێربوونی زانســـتی شـــیرعی عیبادەتە، هەندێ زانا فەرموویانە: (زانســـت نوێژی پەنهانە و عیبادەتی دڵە).[١] هەروەها دەبێت فێرخواز ئەوە بزانێت کە کردەوە وەرناگیرێت تا دوو مەرجی تێدا نەبێت ئەویش:

**أ - نییەت پاکی (إخلاص):** فێرخواز دەبێت لە فێربوونی زانســـتەکەیدا - بەڵکو لەهەموو کردەوەکانیدا - تەنها مەبەستی بۆ خوابێت و لەبەر هیچی تر نەبێت، ئەگینا - پەنا بەخوا - ڕەنج بەخەسار دەبێت.

**ب - شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ:** هەروەها ئەمەش مەرجی دووەمە بۆ وەرگرتنی کردەوە.

**٢- کارکردن بەزانســـتەکەی:** پێویســـتە فێرخوازی زانســـتی شـــەرعی کار بەو زانستەی بکات کە فێری بووە، هەر کەسێکیش نەختێك لە سووڕەتی (العصر) وورد بێتەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێـت، وەکو ئیمـامی شـــافعی (ڕەحمەتی خوای لێبێـت) دەفەرموێت: **(لو ما أنزل الله حجة على خلقه إلا هذه السورة لكفتهم).**[٢] هەروەها

---

(١) (حلية طالب العلم) بكر أبو عبدالله أبو زيد. لا ١٥.

(٢) (ثلاثة الأصول) شيخ الإسلام محمد بن عبدالوهاب.

(هلال بن العلاء) دەفەرموێت: **(طلب العلم شديد، وحفظه أشد من طلبه، والعمل به أشد من حفظه، والسلامة منه أشد من العمل به).**[1]

هەروەها وكيع دەفەرموێت: **(إذا أردت حفظ الحديث فاعمل به).**[2] هەروەها (أكينة بن عبدالله التميمي) لە (حفظ)ـــــيەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت أبي يقول: سمعت علي بن أبي طالب يقول: **(هتف العلم بالعمل، فإن أجابه وإلا ارتحل).**[3]

**٣- ئارامگرتن (الصبر):** یەکێکی تر لەو ئادابانە ئارامگرتنە، چونکە بەڕاستی فێرخوازی زانستی شەرعی پێویستییەکی زۆری هەیە بەئارامگرتن لەڕێی دەستکەوتنی زانستدا، چونکە چەندین کۆسپ دێنە ڕێی ئەگەر ئارامی نەبێت ئەوا بەئامانج ناگات.

(ابن خراش عبدالرحمن بن یوسف)ی ڕافزی دەڵێت: (پێنج جار میزی خۆم خواردووە لەپێناو گەڕان بەدوای فەرموودەدا).[4]

هەروەها ووردبوونەوەی زیاتر لەئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و ژیانی پێغەمبەران و هاوەڵان و پیاوچاکان زانیاری زیاترت سەبارەت بەم

(١) (الكبائر) ی ئیمامی ذهبي.

(٢) (إختصار علوم الحديث) ابن كثير.

(٣) (الجامع) للخطيب، وەرگیراوە لە (حلية الطالب العلم)، لا ٢٤.

(٤) (صلاح الأمة في علو الهمة) (٢٩١/١) د.سيد بن حسين العفاني.

بابەتە بۆ دەردەکەوێ.

**٤- کات بەفیڕۆنەدان:** ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە کە دەبێت فێرخوازی زانستی شــەرعی زۆر ئاگای لێ بێت و ڕێگە نەدات کاتەکانی بەفیڕۆ بچێت. پێشــینانی ئەم ئوممەتە زۆر گرنگییان داوە بەکاتەکانیان. (عامری کوڕی قەیسە) پیاوێك پێی ووت: بووەستە قسەت لەگەڵ دەکەم، ئەویش ووتی: (خۆرم بۆ بوەستێنە).[1]

**٥- ڕەوشــتبەرزی:** خۆڕازاندنەوە بەڕەوشــتە بەرز و جوانەکان و دوورکەوتنەوە لەڕەوشــتە نزم و ناشــرینەکان، بەتایبەتی خۆڕاهێنان لەســەر عیزەتی نەفس و بێ نیازبوون لەوەی کە لەدەستی خەڵکیدایە.

**٦- شــەرم نەکردن و خۆبەگەورە نەزانین:** فێرخوازی زانســتی شەرعی پێویستە شــەرم نەکات لەفێربوونی زانســتی شــەرعی لەهەر کەســێکەوە بێت، ئەگەرچی ئەو کەسەش لەخۆی بچووکتر بێت.

(عمر) ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: **(إن العلم ليس عن حداثة الســن ولا قدمه، ولكن الله تعالى يضعه حيث يشاء).**[2]

هەروەهــا لە (الجــامع)ی ابن عبــدالبر دا (ڕەحمەتی خوای لێبێــت) هــاتووە: **(الجاهل صغير وإن كان شيخا، والعالم كبير وإن كان حدثا).**[3]

---

(١) (صيد الخاطر) ابن الجوزي، لا ٣٤٦.

(٢) (حلية طالب القرآن) أبو عبدالله سيد بن مختار أبو شادي، لا ٨٩.

(٣) (حلية طالب القرآن) أبو عبدالله سيد بن مختار أبو شادي، لا ٨٩.

**٧- بەردەوام بوون:** ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە کە دەبێت فێرخوازی زانستی شەرعی ئەوە بزانێت کە هەتا فێرببێت هێشتا کەمە و ماویەتی، چونکە مرۆڤ تا زیاتر فێرببێت زیاتر بۆی دەردەکەوێت کە جارێ ماویەتی. دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئەگەر فێرخواز شتێکی کەمیش فێربوو دەبێت بیگەیەنێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً)[1].

بۆیە پێویستە فێرخواز لەگەیاندنی زانستی شەرعیدا کەمتەرخەمی نەکات بەڵام بەپێی شارەزایی و توانای خۆی، چونکە زانایان لەکۆنەوە فەرموویانە: (من تكلم في غير فنه أتى بالعجائب).[2] بەهەر حاڵ ئێمە مەبەستمان بەردەوام بوون و دانەبڕانە لەفێربوون.

بەمەش هاتمە کۆتایی ئەم ئادابە، بەهیوای ئەوەی خۆم لەدونیا و دوارۆژدا سوودی لێ ببینم و فێرخوازانی خۆشەویستیش سوودی لێ ببینن و کاری پێ بکەن، داواکارم لەخوای پەروەردگار ئەم کارەم لێ وەرگرێ و بیخاتە سەر تەرازووی چاکەکانم.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه جمعين.

(١) بخاري (٣٤٦١).

(٢) بڕوانە (فتح الباري) كتاب الحج، ٥٨٤/٣.

# سەرچاوەکان

بۆ نووسینی ئەم نامیلکەیە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە، ئەوانیش:

دوای (قورئانی پیرۆز):

١- (صحيح البخاري): للإمام عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري المتوفي (٢٥٦ هـ)، و معه (من هدي الساري شرح غريب صحيح البخاري) للإمام ابن حجر العسقلاني المتوفي (٨٥٢ هـ)، تحقيق : خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، بيروت، لبنان، الطبعة الثالثة، (١٤٣١ هـ).

٢- (صحيح المسلم): للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النيسابوري المتوفي (٢٩١ ه)، حقق أصوله وخرج أحاديثه على الكتب الستة ورقمه الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، بيروت، لبنان، الطبعة الثالثة، (١٤٣١هـ).

٣- (سنن الترمذي): للإمام الحافظ أبي عيسى بن سورة الترمذي، دار الفكر، بيروت، لبنان.

٤- (مسند أحمد بن حنبل): أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، مؤسسة القرطبة، القاهرة.

٥- (مختصر صحيح مسلم): للإمام زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي المنذري، اعتنى به: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، بيروت، لبنان، الطبعة الرابعة، (١٤٣١هـ).

٦- (فتح الباري شرح صحيح البخاري): للإمام الحافظ شهاب‌الدين ابن حجر العسقلاني، دارالمعرفة، بيروت، لبنان.

٧- (صيد الخاطر): أبي الفرج عبدالرحمن بن الجوزي المتوفي (٩٩٧ هـ)، اعتني به محمد بن إبراهيم الشامي، دارالكوثر، القاهرة، الطبعة الأولى، (١٤٣٢ هـ).

٨- (تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي): جلال الدين السيوطي المتوفي (٩١١ هـ)، حققه : أبو قتيبة نظر محمد الفاريابي، مؤسسة الريان، بيروت، لبنان، الطبعة الثانية، (١٤٣٠ هـ).

٩- (الباعث الحثيث شـرح اختصـار علوم الحديث لإبن كثير): احمد محمد شاكر، اعتني به وراجعه: عاطف صابر شاهين، دار الغد الجديد، القاهرة، الطبعة الأولى، (١٤٢٧ هـ).

١٠- (شـرح رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين): للإمام الحافظ الفقيه أبي زكريا محي الدين يحيى النووي المتوفي (٦٧٦ هـــ)، شـرح واملاء : فضـيلة علامة الشـيخ محمد بن صـالح العثيمين، مؤسسة الرسالة الناشرون، بيروت، لبنان، الطبعة الأولى (١٤٣٣ هـ).

١١- (شـرح الكبائر): للإمام الحافظ أبي عبدالله محمد بن احمد بن عثمان الذهبي، من كلام الإمام العلامة محمد بن صـــالح العثيمين، أعداد وتحقيق: أبي عبدالرحمن عادل بن ســعد، الدار الذهبية ، القاهرة.

١٢- (شــرح ثلاثة الأصــول): للإمام محمد بن عبدالوهاب التميمي النجدي المتوفي (١٢٠٩ هـــ)، شرحها: فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، علق عليها وخرج أحاديثها : هاني الحاج، دارالكتب العلمية، بيروت، لبنان، (١٤٢٧ هـ).

١٣- (شرح حلية الطالب العلم ): للشيخ بكر أبو زيد، شرح الشيخ محمد بن صالح العثيمين، تقديم وتحقيق الدكتور يحيى مراد، مؤسسة المختار، القاهرة، الطبعة الأولى، (١٤٢٧ هـ).

١٤- (صـلاح الأمة في علو الهمة): الدكتور سيد بن حسين العفاني، مؤسسة الرسالة، بيروت، لبنان، طبعة الثانية، (١٤١٨ هـ).

١٥- (ديوان الامام الشـافعي): اعتنى به عبدالرحمن المصطاوي، دار المعرفة، بيروت، لبنان، الطبعة السادسة، (١٤٤٠ هـ).

١٦- (عاشـق): د. عائض القرني، مؤســسـة الريان، بيروت، لبنان، البطبعة الخامسـة، (١٤٣٢ هـ).

١٧- (آداب الطالب مع الشـيخ، منهج تربوي توجيهي لطالب العلم الشرعي): خالد بن خليل

بن ابراهيم الزاهدي، مكتبة أمير، عراق، كركوك، الطبعة الأولى (١٤٣٢هـ).

١٨- (حلية طالب القرآن آداب المعلم والمتعلم في حلقات تحفيظ القرآن الكريم): جمع وترتيب: أبو عبدالله سيد بن مختار أبو شادي، دار بن الجوزي ، القاهرة، الطبعة الأولى، (١٤٣٢ هـ).

١٩- (رياض الصالحين من حديث سيد المرسلين) تصنيف: الإمام المحدث الفقيه محي الدين يحيى بن شرف النووي المتوفي (١٧٩ ه)، حققه وضبط نصه وخرج أحاديثه: علي بن حسن بن علي بن عبدالحميد الحلبي الأثري، دار ابن الجوزي، القاهرة، الطبعة السادسة، (١٤٣٢ هـ).

٢٠- (تەفسیری ڕامان لە مانا و مەبەستی قورئان): ئەحمەد کاکە مەحمود، دار الفكر، بەیروت، لوبنان، چاپی دووەم، (١٤٣٠ هـ).

# ناوەڕۆك